# پەرستراوی خۆت بناسە

## نوسینی: باوکی موعاز



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

خوێنەری خۆشەویست وەکو ئاشکرایە مرۆڤ کە دێتە ناو بازنەی ئیسلام دەبێت بڵێت: لاإلە إٌلاالله بەڵام حەقی خۆیەتی واتای(لاإلە إٌلاالله) وەکو خۆی بزانین، چونکە زۆرێک لە خەڵکی باوەڕیان وەکو چاو لێ کردنێک و تەقلید وەرگرتوە. کەواتە، بابزانین پێغەمبەر مەزن ﷺ لە سەرەتای بانگەوازی بۆ دەیفەرموو: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، قُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ تُفْلِحُوا)(أحمد/١٦٠٢٣

واتە: ئەی خەلکینە بڵێن: (لاإلە إلاالله) سەرفراز دەبن.

بەڵام ئیسلام فێرمان دەکات کە هیچ قسەیەک یان هیچ کردارێک نەکەین تاوەکو نەزانین واتاکەی چیە !

جێگای داخە ئەوەی لەم ڕۆژگارە دەبینین و دەبیستین بەبێ ئەوەی هیچ بیر لە واتای کردار و گوفتارمان بکەینەوە و هەرچی بۆمان بگوترێت و بکرێت دەربازی ناکەین بەڵام با بزانین الله تعالى لەم ئایەتە چی دەفەرمووێت: (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ)الإسراء/٣٦

واتە: بە دوای شتێکدا مەچۆ کە نەزانن چیە و چۆنە و زانیاریت دەربارەی نیە.

واتە: تا بە تەواو ی زانستت بە شتێك نەبێت هەنگاوی جیددی بۆ نەنێیت و قسەی لێ نەکەیت و بە دوای مەکەوە.

کەواتە، ئەگەر بمانەوێت سەر فرازی دونیا و دوا ڕۆژ بین با بڵێین: (لاإلە إّلاالله) بەڵام زۆر پێویستە بزانین(لاإلە إلاالله) واتە چی؟

(لإله إلالله) واتە، هیچ پەرستراوێک نیە شایەن و شایەستەی پەرستن بێت جگە لە (الله) و دەبێت بزانین (لإله إلالله) دوو بڕگەیە (لإله) نەفیە واتە، نکۆڵی کردنە لە هەموو پەرستراوێک (إلا الله) إثباتە, واتە، جێگیر کردنە پەرستراوەتی تەنها بۆ الله جێگیر دەکات.

تێبینی: لە زاراوەی عەرەبی نفی و إثبات واتای (حصر و قصر) دەگەینێت واتە: یەکەم برگە نکۆلی دەکات لەهەموو ئەوەی باسی دەکات و جێگیری دەکات تەنها بۆ بڕگەی دووەم (لاإله إلاالله) نکۆلی کردنە لە هەموو پەرستڕاوێك تەنها بۆ الله جێگیری دەکات.

ئەگەر بە وردی شی بکەینەوە دەڵێین: وشە (إله) واتە: پەرستراو .

پەرستراویش دەبێت جێبەجێ کاری هەموو فەرمانەکانی بین و خۆمان لە هەموو قەدەغەکراوەکانی بەدوور بگرین.

کەواتە، هیچ ئیلاهێک نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله تعالی.

کەواتە، بۆ سەلماندنی ڕاست گوتنمان دەبێت ئەو شتانەی تایبەتە بە الله تعالی بۆ هیچ شتێکی تر جێگیر نەکەین، واتە، الله تعالی تاکە لە ناو و سیفاتی تایبەت بە خۆیی، و ئەگەر بمانەوێت ئەو شتانەی

تایبەتە بە اللە تعالی بزانین با سەیری قورئان بکەین هەر کاتێک وشەی تەوحید هات لەگەڵی یەکێک لە تایبەتمەندیانی اللەتعالی لەگەڵی باس دەکرێت بۆ نمونە، هەندێک لەو شتانەی تەنها بۆ اللە ئەنجام دەدرێت و بریار دەدرێت لەو شتانەی تەیبەتە بە خۆی.

## یەکەم (العبادة)

لەو تایبەتمەندیانەی تەنها بۆ (الله) ئەنجام دەدرێت پەرستنە.

وشەی (عبادة) چەندها پێناسەی بۆ کراوە, پێشەوا ئیبن تەیمیە (رحمەالله) دەفەرموویت: (العبادة هي اسم جامع لكل مايحبه الله ويرضاه من ألقوال والعَمل الظاهرةوالباطنية) واتە: پەرستن ناوێکی گشتگیرە بۆ هەموو ئەو شتانەی الله تعالى خۆشی دەوێن و پێیان ڕازییە لە وتەو کردەوەی پەنهان و ئاشکراکان.

بەڵام، کورترین واتا بۆ عبادة دابنێین کە واتایەکی پڕ بە پێستی خۆی بێت دەتوانین بڵێین: (الطاعة) واتە، گوێڕایەڵی، کەواتە، جگە لە الله تعالى هیچ شتێک نەپەرسترێت، هەر شتێک پێی بگوترێت پەرستن حەڕام وناپەسندە بۆ جگە لە الله ئەنجام بدرێت .

چونکە الله تعالى دەفەرموویت: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا) الإسراء/٢٣/ واتە: پەروەردگارت بڕیاریداوە و وەسیەتی کردوە کە دەبێت هەر خۆی بپەرستن .

هەر ئەوەشە مەبەست لە دروست کردنی مرۆڤ الله تعالى فەرموویتی: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّالِيَعْبُدُونِ)٥٦ الذاريات، واتە: من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیزادم دروستکردووە بۆ ئەوەی بمپەرستن و بمناسن.

پێشەوا إبن القيم (رحمەالله) دەفەرموێت: (العبادة (هي كَمل الذل مع كَمل المحبة) واتە: پەرستن ئەوپەری زەلیل بوونە لەگەڵ ئەو پەری خۆشویستن.

ئەمەش تەنها بۆ ئیلاهی جیهانیان ئەنجام دەدرێت.

الله تعالى هەر هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئادەمیزاد ناردوە تەنها بۆ ئەوەی الله سبحانە و تعالى یان پێ بناسێنێت بۆ ئەوەی بیپەرستن هەر وەکو الله تعالى دەفەرمووێت: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)٢٥/الأنبياء واتە: لە پێش تۆشەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر پەیامبەرێکمان ناردووە وەحیی و سروشمان بۆ کردووە کە هیچ پەرستراوێک جگە لە من نییە، جا کەوایە هەر بەتەنها من بپەرستن.

هەروەها فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کە فەرمووی: (حق الله على العباد ان يعبدوه ولا يشركوا بەشيئا)٢٨٥٦البخارى واتە: مافی اللە تعالی لە سەر بەندەکانی ئەویە کە بیپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن.

کەواتە: پەرستن بۆ جگە لە اللە شیرکە و ناپەسەندە، چونکە پەرستن تایبەتە بە اللە تعالی.

## دووەم: (الدعاء)

دوعاء، واتە: پارانەوە، دوعاء، ئەگەر لە دەسەڵاتدارەوە بێت بۆ بێ دەسەڵات؟ واتای فەرمان دەگەینێت، بەڵام ئەگەر لە بێ دەسەڵاتەوە بێت بۆ دەسەڵاتدار؟ واتای پاڕانەوە دەگەینێت.

پاڕانەوەش بەشێکە لە پەرستن، هەر وەکو پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێت: (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ) واتە: پاڕانەوە پەرستنە.

چونکە جێبەجێ کردنی فەرمانی إلەی بێ هاوتایە کە دەفەرمووێت: (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ )٦٠ الغافر.

واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لە من بکەن و تەنها لە من بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە.

واتە: پاڕانەوە لە الله تعالی جۆرێکە لە پەرستن، بۆیە، نابێت ئەم جۆرە پەرستنە بۆ جگە لە الله تعالی ئەنجام بدرێت،

دەبێت بزانین پشتکردن لە پارانەوەی ئیلاهی عالمین دەبێتە هۆی توڕەبوونی الله تعالی، هەر وەکو پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی:

(إِنَّهُ مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ)٣٣٧٣ الترمذی. واتە: هەر کەسێک واز لە پاڕانەوەی خالقی بەخشندە بهێنێت الله تعالی لێی تورە دەبێت.

کەواتە، نابێت لە کەس بپاڕێینەوە چونکە پاڕانەوە پەرستنە، و پەرستنیش تەنها بۆ الله تعالی ئەنجام دەدرێت.

بەڵام پاڕانەوە ڕێپێدراوە لە بەندەکان بە چوار مەرج دەبێت

١-ئەو کەسەی لێی دەپاڕێیەوە زیندوو بێت.

٢-ئەو کەسەی لێی دەپاڕێیەوە ئامادە بێت.

٣-ئەو کەسەی لێی دەپاڕێیەوە توانای لەسەر داواکەت هەبێت.

٤-ئەو کەسەی لێی دەپاڕێیەوە تەنها بە هۆکاری بزانیت.

چونکە بەخشەری ڕاستەقینە ئیلاهی بەخشندەیە.

بەڕێزانم ئیسلام ئێمەی فێرکردوە بۆ یەکتر بپاڕێینەوە نەک لەیەکتر بپاڕێینەوە با ئەو کەسەی لە الله تعالی دەپاڕێتەوە بۆ براکەی لەو برایەشی کەمتر بێت لە پلە و لە زانست و پەرستندا .

بزانە پێغەمبەری الله ﷺ داوامان لێ دەکات کە بۆی لە خالقی گەورە بپاڕێینەوە بۆ ئەوەی پلە بەرزەکەی وەسیلەی پێ ببخشێت هەر وەکو فەرموویەتی: ئەگەر گوێبیستی بانگ بێژ بوون ئێوەش وەکو ئەو بڵێنەوە و پاشان سەڵاواتم لە سەربدەن ئەوجا: (سَلُوا اللَّهَ لِي الْوَسِيلَةَ) ٣٨٤مسلم واتە: لە ئیلاهی بێ هاوتا بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی وەسیلەم پێ ببخشێت .

ئێمەش ڕۆژانە پێنج جاران بۆ پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەپاڕێینەوە لەو کاتەی گوێمان لە بانگ دەبێت و دەڵێین: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ) البخاري/٦١٤ واتە، یارەبی پەروەردیگارە ئەوە پاڕانەوەیەکی تەواوە و خەریکە نوێژەکەش ئەنجام بدرێت پلەی وەسیلە و شوێنی ستایش کراو بە محمدی پێشەوا ﷺ ببەخشە ئەوەی بەڵێنت پێی داوە.

بەڵام بە داخەوە کە بە خۆشمان نازانین چی دەڵێین، کەواتە: پاڕانەوە جگە لە الله شیرکە هەر وەکو باسمان کرد چونکە پاڕانەوە جۆرێکە لە

پەرستن، دەبێت بزانین هەر کردارێك (أ س ت)ی لە سەر بێت واتای داوا دەگەینێت وەکو: (استعانە، استغاثە، استعاذە، استغفار) چونکە هەمووی واتای داوا کردنە.

## سێیەم (الحَلِف)

حلف، واتە، سوێند.

سوێند خواردن بۆ ئەوەیە بەرامبەرەکەت دڵنیا بکەیەوە لەسەر ڕاستی ئەو شتەی دەیڵێی، دروستکاری گەورە سوێند بەهەر شتێک بخوات بە ئارەزووی خۆیەتی چونکە: (لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ) ٢٣/الأنبياء واتە: ئەو زاتە چی بکات نابێ لێی بپرسرێتەوە چونکە ئیلاهە، بەڵام لە کاروکردەوەی ئەوانە پرسیار دەکرێت چونکە بەندەن، کەوابوو دەبێ هەر گوێڕایەڵی ئەو بن و ئەو بپەرستن.

کە الله تعالی سوێند بە شتێک دەخوات تەنها بۆ ئەوە سوێند دەخوات بۆ ئەوەی گەورەیی ئەو شتەمان بۆ دەربخات کە سوێندی پێ دەخوات، بەڵام ئێمەی بەندە نابێت سوێند بە هیچ شتێک بخۆین تەنها بە الله تعالی یان ناوێک لە ناوەکانی یان سیفەتێک لە سیفەتەکانی الله تعالی نەبێت، چونکە، هەر خۆی پیرۆز و بەرزە نابێت هیچ شتێک بە پیرۆز بزانین بەو ڕادەیەی سوێندی پێ بخۆین تەنها الله تعالی نەبێت.

سوێند، لە زاراوەی عەرەبی پێی دەگوترێت: (حلف يمين قسم) ئەو سێ ناوەی هەیە، بەڵام چەند جۆرە سوێندمان هەیە.

سوێندی (لغو) سەر زارەکی.

سوێندی(غموس) نقووم کەری خاوەنەکەی بۆ ناو دۆزەخ.

سوێندی (معقد) بەستراو بە دڵ

سوێندی(شركي) هاوبەشی سوێندە بە جگە الله تعالى

- سوێندی لەغو، واتە: سوێندی سەرزارەکی هەر وەکو دایکی باوەڕداران دەفەرمووێت: (نُزِلَت هذه ٱلآيَة (لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ) فِي قَوْلِ الرَّجُلِ :لَاوَاللَّهِ وَبَلَى وَاللَّهِ/ ٤٦١٣/البخاري

واتە: ئەم ئایەتە، دابەزی مەبەست پێی ئەوەیە کابرا دەڵێت ناوالله بەڵێ والله.

- سوێندی غەمووس، سوێند خواردنە بەدرۆ و دەشزانێت درۆیە بۆیە پێی دەگوترێت غەمووس چونکە خاوەنەکەی نوقمی ناو دۆزەخ دەکات پەنا بە الله چونکە سوێندی بە درۆ یەکێکە لە تاوانە گەورەکان هەروەکو پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێت:

(أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ ثَلَاثًا قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّه .قَالَ :الْإِشْرَاكُ بِاللَّه، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: أَلَا وَقَوْلُ الزُّورِ، قَالَ : فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ(٢٦٥٤/البخاری

واتە: ئایا پێتان بڵێم: گەورەترینی تاوانەکان چیە؟ سێ جار دووبارەی کردەوە هاوەڵەکان گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هاوەڵ دانان بۆ الله تعالى و خراپە لەگەڵ دایک و باوک، پاڵ کەوتبو دانیشت وگوتی: قسەی درۆ ئەوەندە دووبارەی کردەوە گوتمان خۆزگا بێدەنگبا واتە، وەکو بەزەیان پێی هاتەوە.

- سوێندی، موعەقەد، سوێند خواردنە بە دڵ.

واتە، سوێند بخۆی لە سەر شتێک کە لێی دڵنیابی بەڵام بۆی هەیە پەشیمان ببتەوە لە سوێندەکەی ئەگەر بۆی دەرکەوێت پێچەوانەکەی چاکرتە سوێندەکەی دەشکێنی و کەفارەتی سوێندەکە دەدات، هەر وەکو پێشەوای دڵسۆزمان ﷺ دەفەرموێت: (إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَنْظُرِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ فَلْيَأْتِهِ) ٣٧٨٢ /النسائي واتە: ئەگەر کەسێک سوێندی لەسەر

شتێک خوارد و بۆت دەرکەوت پێچەوانەکەی چاکترە با سوێندەکەی بشکێنێت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات و پێچەوانەکەی ئەنجام بدات .

- سوێندی شیرکی، ئەویش سوێند خواردنە بە جگە لە الله تعالی.

خۆشەویستانم بەندە تەنها بۆی هەیە سوێند بە دروستکاری گەورە بخوات بزانە شەیتانی نەفرەتی سوێند بەعیزەتی الله دەخوات و دەڵێت: (فَبِعزتك)٨٢ ص واتە: بە عیزەت و دەسەڵاتی تۆ ئەی پەروەردیگارە هەموو نەوەی ئادەم فریو دەدەم و لە خشتەیان دەبەم .

و با بیزانین هاو بەشکاران سوێند بە چ شتێک دەخۆن (قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ) ٢٣/ألنعام واتە: سوێند بە پەروەردگارمان هەرگیز ئێمە هاوبەشمان بۆ الله تعالی دانەناوە.

بەڕێزان فەرموودەیەک هەیە پێتان سەیر نەبێت ئەگەر نەتان بیستبێت بەڕاستی جێگای خۆیەتی هەڵوێستێکی لەسەر بکەین، تەماشای ئەم جولەکەیە بکەن کە هاتە خزمەتی پێغەمبەری الله ﷺ و گوتی: ئەی محمد ﷺ بەڕاستی: (إِنَّكُمْ تُنَدِّدُونَ وَإِنَّكُمْ تُشْرِكُونَ؛

تَقُولُونَ: مَا شَاءَاللَّهُ وَشِئْتَ. وَتَقُولُونَ :وَالْكَعْبَةِ .فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ(ﷺ)إِذَا أَرَادُوا أَنْ يَحْلِفُوا أَنْ يَقُولُوا: وَرَبِّ الْكَعْبَةِ .وَيَقُولُونَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ شِئْتَ/٣٧٧٣/ النسائی واتە: ئەی محمد ﷺ ئێوە هاوبەش بۆ الله بڕیار دەدەن، لەو کاتەی دەڵێن: ئەگەر الله بیەوێت و تۆش بتەوێت و دەڵێن: سوێند بە کەعبە، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستتان سوێند بخۆن بڵێن بە خاوەنی کەعبە و بڵێن ئەگەر الله ویستی ئەوجا تۆ ویستت.

ئازیزانم بەڕاستی کە چاوم بەم فەرموودەیە کەوت زۆر خەفەت بار بووم بۆ حاڵی مسوڵمانانی ئەم سەردەمە والله جێگای داخە تاکو ئێستا زۆرێک لە مسوڵمانان بە ئەندازەی جولەکەیەک لە ئێسلام نەگەیشتونە، کەواتە، مسوڵمانی ڕاستەقینە تەنها سوێند بە الله یاخود بە ناوێک لە ناوەکانی یان سیفەتێک لە سیفەتاکانی دەخوات .

ئەگەر سوێندیشی خوارد و بۆی دەرکەوت پێچەوانەی سوێندەکەی باشترە با سوێندەکەی بشکێنیت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات،

واتە، کەسێک دەڵێت: واللە ناچمە ماڵی برام، ئەوە واجبە برواتە ماڵی برای بەڵام سوێندیشی خواردوە؟ دەڵێین: سوێندەکەت بشکێنە و کەفارەتی سوێندەکەت بدە، چونکە، اللە تعالی دەفەرموویت: (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ)٢٢٤ ٱلبقرة واتە: سوێندەکانتان مەکەنە بەربەست بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە .

کەواتە، جێگای خۆیەتی بە خۆماندا بچینەوە بۆ ئەوەی ڕاستە شەقامی ئیسلام بدۆزینەوە و سەربەرزی مسولمانانی پێشینان بەدەست بێنین.

## چوارەم (علم الغيب)

وشەی (غيب) هي ما غاب عن حواس الخمس.

واتە، غەييب شتێکە درکی پێ ناکرێت بە پێنج هەستیارەکان

١ـ بينين

٢ـ بۆنکردن

٣ـ تامکردن

٤ـ بيستن

٥ـ دەست لێدان

چونکە الله تعالی بۆمان باسی دوو جۆرە زانستی کردوە

١ـ علم الغيب، زانستی پەنهان

٢ـ علم الشهادة، زانستی ئاشکرا

الله سبحانە وتعالی تەنها بەخۆی زانای هەردوو زانستەکەيە، هەروەکو الله تعالی دەفەرموویێت: (عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ) الرعد/٩

واتە: الله تعالی ئەو زاتەيە بەگشت نادیارو دیارێک زاناو ئاگادارە .

بەڵام مرۆڤ تەنها زانستە ئاشکراکە درک پێ دەکات.

واتە، هەر شتێک درک پێ نەکرێت بە پێنج هەستیارەکان جگە لە الله تعالی نایزانێت هەر وەکو الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ﴾٥٩/الأنعام واتە:کلیلی گشت گەنجینە پەنهانەکان لای اللەیە هەر ئەویش پێیان دەزانێت و تەواوی کارە نادیارەکانیش لای ئەو ئاشکرا و دیارن.

کەواتە، هەر کەسێک بانگشەی ئەوە بکات کە شتێک لە غەیب دەزانێت کافر دەبێت چونکە یەکێک لە تایبەتمەندیەکان الله تعالی بۆ خۆی جێگیر دەکات یاخود کەسێک گومانی وابێت کەسێک شتێک لەغەیب دەزانێت ئەو کەسەی کردۆتە هاوبەش لەگەڵ الله تعالی لەو تایبەتمەندیە کە غەیبە، تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ هیچ شتێک لە غەیب نازانێت مەگەر الله تعالی پێی بڵێت لە داهاتوو چ ڕوودەدات ئەویش وەکو بەڵگەیەک لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی، بزانە دایکی باوەڕداران چی دەفەرمووێت: (مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ (ﷺ)يُخْبِرُ بِمَا يَكُونُ فِي غَدٍ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ) مسلم/١٧٧

واتە: هەر کەسێک بڵێت: پێغەمبەرﷺ دەزانێت بەیانی چ ڕوودەدات بەڕاستی بوختانێکی گەورەی بەالله کردوە.

چونکە الله تعالى دەفەرموێت: (قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ) النمل/٦٥ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: هیچ کەسێک پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی نازانێت بێجگە لە الله سبحانە وتعالی .

کەواتە، دەبێت بزانین هەر شتێک تایبەت بێت بە الله تعالی ناپەسندە بانگشەی بۆ بکەین و هەر کەسێکیش بانگشەی بۆ کرد بە درۆزنی بزانین ئەگەر ڕاستیش دەرکەوێت چونکە جاری وایە ساحیر و جادوگەر شەیتانەکان نۆەت و نۆ درۆیان بۆ دەڵێن یەک قسەی ڕاستیش لەگەڵ دەکەن بەڵام بە داخەوە خەڵکانێک نۆەت و نۆ دورۆیەکەیان لەبیر دەچێت و قسە ڕاستەکە دەکەنە بەڵگە لەسەر فێڵەکانیان، بەڵام ئازیزم بەدڵ گوێ لەو هەڕەشەی پێغەمبەری الله تعالیﷺ بگرە کە دەفەرموێت: (مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ؟لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً) ٢٢٣٠/مسلم واتە، هەر کەسێک بچێتە

لای جادوگەرێک پرسیاری شتێکی لێ بکات نوێژی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێت .

دەبێت بیشیکات بەڵام وەکو سزایەک لێی قبول ناکرێت باشە ئەمە تەنها ئەگەر پرسیاری لێ بکات، ئەدی ئەگەر قسەکەی بەڕاست بزانێت؟ دەفەرمووێت: (فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ٦٩٣/إبن ماجه واتە: ئەگەر باوەڕ بە قسەکەی بکات ئەوە کافر دەبێت بەوەی بۆ پێغەمبەری ﷺ دەبەزیوە, کە قورئانە.

کەواتە، براکانم با باوەڕی خۆمان لەدەست نەدەین بۆ فێل و درۆی کەسانێکی تر .

## پێنجەم (النذر)

النذر، ما أوجب المرئ على نفسه مالم يوجبه الشرعليه.

نذر، بەکوردی پێی دەگوترێت، نەزر، نەزریش لەخۆ گرتنی پەرستنێکە بەبێ ئەوەی شەریعەت لە سەری فەرز کردبێت.

خۆشەویستانم هەموو پەرستشێک گەورەیە و جێگای ڕەزامەندی اللەیە بەڵام دوو جۆرە پەرستش هەیە جێگایەکی گەورەی هەیە لە ئیسلام ئەویش نوێژ و خوێن ڕشتنە بۆ اللە تعالی، چونکە نوێژ پەرستشێکی لاشەییە و خوێن ڕشتنیش ماددەییە، لە دوو شوێن اللە تعالی هەردووکی بەیەکەوە باس کردوە .

یەکەم: (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنحَر) ٢/الكوثر واتە، نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت و لە سوپاسی ئەو هەموو چاکەدا هەر بۆ ئەو قوربانی سەر ببڕە .

دووەم: (قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِين) الأنعام ١٦٢ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: بە ڕاستی نوێژ و حەج و

قوربانیی و ژیان و مردنیشم گشت تەنها بۆ اللەی پەروەردگاری جیهانەکانە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت: (لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغيْرِ)١٩٧٨/مسلم واتە، نەفرین کراوە ئەو کەسەی بۆ جگە لە الله شتێک سەر ببڕێت .

کەواتە، بۆمان دەرکەوت سەربڕین تەنها بۆ الله ئەنجام دەدرێت، دەبێت بزانین ئەوەی الله سبحانه وتعالی نووسویەتی ڕەد ناکرێتەوە بە هیچ هۆکارێک چونکە دروستکاری بونەوەر دەفەرموویت: (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) القمر/٤٩/ واتە: بەڕاستیی ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەیەکی دیاریکراو درووستکردووە .

کەواتە، نەزر لەخۆ گرتن هیچ شتێک ناگۆڕێت بەڵام ناخی ئەو کەسە ڕەزیلە بۆمان دەردەکەوێت، هەر وەکو رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: (إِنَّ النَّذْرَ لَا يُقَدِّمُ شَيْئًا وَ لَا يُؤَخِّرُ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِالنَّذْرِ مِنَ الْبَخِيلِ)٦٦٩٢/البخاري واتە: بە ڕاستی نەزرکردن نە هیچ شتێک نێزیک دەکات نە هیچ شتیش دوور دەخاتەوە بەڵکو لە کەسی ڕەزیل دەردەچێت.

باشە بەڵام کەسێک دەڵێت: جاری واهەیە لەگەڵ نەزرەکە مەبەستەکە دێتە دیَ؟ دەڵێین: ئەوە قەدەری اللەیە بۆ سەلماندنی ئەوەش پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموویێت: (لَا يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ بِشَيْءٍ لَمْ يَكُنْ قُدِّرَ لَهُ، وَلَكِنْ يُلْقِيهِ النَّذْرُ إِلَى الْقَدَرِ، قَدْ قُدِّرَ لَهُ) البخاري/٦٦٩٤ واتە: نەزرکردن هیچ شتێک بۆ نەوەی ئادەم نایەنێتە دیَ ئەگەر بۆی نەنووسرابێت، بەڵام جاری وایە نەزر لەگەڵ قەدەر یەک دەگرێتەوە و ئەوەی بۆی نووسرابێت دێتە دیَ.

بەڵام ئەگەر کەسێک نەزرێکی لەخۆی گرت دەبێت جێبەجێی بکات چونکە یەکێک لەسیفاتی باوەڕداران ئەوەیە کە (يُوفُونَ بِالنَّذْرِ) الإنسان/٧ واتە، لە دونیادا هەرشتێك نەزر بکەن و بڕیاری لەسەر بدەن لە چاکە، وەفای پێ دەکەن و پێی هەڵدەستن، بێ کەم و کورتی .

بەڵام نەزر کردن دەبێت تەنها لە خێر و چاکە بێت بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات نەک لە تاوان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلَا يَعْصِهِ)البخاري/٦٦٩٦

واتە: هەر کەسێک نەزری کرد کە دەبێ گوێرایەڵی الله بێت، با جێبەجێی بکات، بەڵام کەسێ نەزری کرد یاخی بێت لە الله نابێ قسەکەی جێبەجێ بکات و یاخی ببێت.

کەواتە، باوەڕداری ڕاستەقینە ئاگاداری کارو کردەوەکانیەتی نەوەک بە ئاسانترتین کردەوە باوەڕەکەی لە دەست بدات پەنا بەالله.

## شەشەم (التو کل)

الله تعالی دەفەرموویێت: (لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً)٩المزمل /واتە: بێجگە لە الله هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جا تۆش بەردەوام هەر ئەو بکە بە پارێزەر و پشتیوان و کاروبارت تەسلیمی ئەو بکە.

کەواتە، بۆمان دەرکەوت تەنها پشت بەالله دەبەسترێت.

بەڕێزەکانم (توکل) واتە: پشت بەستن و تەسلیم بوونی بێ دوودڵی.

مرۆڤی باوەڕداریش پشت بەغەیری الله نابەستێت چونکە هەموو کاروکردەوەی گەردوون لەژێر فەرمانی اللەتعالی یە .

کەواتە، هەر کەسێک بیەوێت دڵنیابێت و کارەکانی لە ژێر فەرمانی ئیسلام بێت با تەنها پشت بە الله ببەسێت،

چونکە الله بەسە ببێتە پاڵپشت، هەر وەکو الله تعالی دەفەرموویێت:

(أَلَيسَ ٱللهُ بِكَافٍ عَبدَهُۥ)٣٦/الزمر/واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا الله بەس نیە بۆ بەندەکەی خۆی؟

واتە: هەر الله تعالی بەسە کە بەندەکان کارەکانی خۆیان پێی بسپێرن.

براکانم، کەسانێکی دوور لە ڕاستە شەقامی ئیسلام هەر کاتێک پشت بە کەسێک ببستن بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسە ناودار بێت یاخود دەسەڵاتداربێت زۆر هەست بەدڵنیایی دەکەن، چونکە، باوەڕی تەواویان بەو کەسە هەیە، خۆ جێگای خۆیەتی باوەڕدار پشت بەو زاتە ببەستێت کە هەموو گەردوون لە ژێر فەرمانەکانی دەگوزەرێت، بەڵام چ پشت پێ بەستینێک؟ بەو شێوازە پشت بە الله ببەستین ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا) الترمذي/٢٣٤٤ واتە: ئەگەر ئێوە پشت بە الله ببەسنت وەکو پێویست ڕۆزیتان دەدات هەر وەکو چۆن ڕۆزی بالندە دەدات، بەیانی لە هێلانەی دەردەچێت بەبرسیەتی و ئێوارە دەگەڕێتەوە بەسک تێری.

واتە: ئێمە پێویستە هەوڵبدەین بەڵام بزانین ڕۆزی دەری ڕاستەقینە الله تعالى یە ئەم فەرموودەش هانمان دەدات بۆ کارکردن ئینجا پشت بەستن بە الله تعالى دەبێت بزانین جێگای پشت بەستن دڵە

کارکردنیش ئیشی جەستەیە هەردووکیشیان تەواوکەری یەکترن دوو نموونە باس دەکەین بۆ ئەوەی واتاکەمان بۆ ڕوون بێتەوە جارێکیان، پێشەوا شافعی لەگەڵ پێشەوا مالک (ڕەحمەتی اللەیان لێ بێت) جیاوازیان کەوتە نێوان لە سەر ئەم فەرموودەیەی باسمان کرد پشەوا مالک فەرمووی: هەرکەسێک بەتەواوی پشت ببەستێت بە اللە ڕزق و ڕۆزی بەدەست دێنێت، بەڵام پێشەوا شافعی فەرمووی: دەبێت مرۆڤ هەوڵبدات ئینجا ڕزق و ڕۆزی بەدەست دێنێت پێشەوا شافعی بە غەمباری لای مامۆستاکەی(مالک) ڕۆیشت، پیرە پیاوێکی بینی سینیە خورمایەکی پێ بوو پێی فەرموو: بۆتی هەڵگرم؟ ئەویش گوتی: بەڵێ پێشەوا شافعیش خورماکەی پیرە پیاوەکەی گەیاندە شوێنی مەبەست پیرە پیاوەکەش بەشێک لە خورماکەی پێ بەخشی پێشەوا شافعیش بە دڵ خۆشیەوە گەڕایەوە لای پێشەوا مالک و چیرۆکەکەی بۆ باسکرد و فەرمووی: ئەگەر من هەوڵم نەدابا خورمام دەست نەدەکەوت پێشەوا مالکیش چەند

دەنکە خورمایەکی خوارد و فەرمووی: بەڵام من بەبێ هەوڵدان خورمام دەست کەوت.

نموونەی دووەم: (إبراهیمی کوڕی أدهم) بازرگانبوو لە ڕێگادا باڵندەیەکی بینی باڵەکانی شکابوو ویستی بزانێت چۆن ئەو باڵندەیە خۆراکی دەست دەکەوێت؟ لە ناکاو باڵندەیەکی تری بینی خۆراکی بۆ باڵندە باڵشکاوەکە هێنا و پێی بەخشی (إبراهیمی کوڕی أدهم) بڕیاریدا واز لە بازرگانی بهێنێ بەڵام کە پێشەوا (شبلی) هەواڵەکەی بیست بە ابراهیمی کوڕی أدهمی فەرموو: چۆن واز لە بازرگانیەکە دەهێنی؟ إبراهیمی کوڕی أدهمیش چیرۆکەکەی بۆ باسکرد پێشەوا (شبلیش) فەرمووی: چۆن ڕازی دەبی ببی بە باڵند باڵشکاوەکە بۆ نابی بە باڵندە بەخشندەکە بۆیە إبراهیمی کوڕی أدهمیش پەشیمان بوویەوە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموویت: (ٱلْمُؤمِنُ القَويّ خَيرٌ وَأَحَبُّ إلى اللهِ مِنَ ٱلْمُؤمِنُ ٱلضَعِيف وَ فِي كُلِ خَير) مسلم٢٦٦٤ واتە: باوەڕداری

بەهێز چاکتر و خۆشەویسترە لە لای الله تعالی لە باوەڕداری لاواز و هەردووکیشیان چاکن.

کەواتە، ڕۆزی بەخشی ڕاستەقینە الله تعالی یە.

و بەشێکیشی هەوڵدانی پێویستە هەردوکیشیان تەواوکەری یەکن نەک دژ بەیەک چونکە الله تعالی فەرمانی پێکردین هەوڵبدەین و تەنها پشت بەو ببەستین هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ بە پیاوەکەی فەرموو: (إعِقلْهابُمَّ تَوَكَل)الترمذي/٢٥١٧واتە: وشترەکەت ببەستە ئەوجا پشت بە الله ببەستە .

## حەوتەم (الحكم)

الله سبحانه و تعالى دەفەرموویێت: (وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ(٨٨/القصص واتە: جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە، هەر هەموو شتێک تیا دەچێت جگە لە ڕووخساری پیرۆزی الله تعالى نەبێت، بڕیار و دادوەریی هەر شاییستەی خۆیەتی، هەر هەمووتان بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموویێت: (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ وَ إِلَيْهِ الْحُكْمُ)٥٣٨٧/النسائى واتە: بەڕاستی الله تعالى هەر خۆی دادوەرە و هەر بۆ لای ئەویش دادوەری دەگەڕێندرێتەوە.

چونکە، حوکم کردنیش جۆرێکە لە پەرستن هەر وەکو الله تعالى فەرموویەتی: (إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ)٤٠يوسف/ واتە: بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە الله تعالى شایستەی کەسی تر نییە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی هێچ شتیتر نەپەرستن، هەر ئەوەشە

ئایین و بەرنامەکەی پەسەند و ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەو ڕاستیە نازانن و لێی بێ ئاگان .

براکانم سەرنجتان بۆ ئەو تێبینیە ڕادەکێشم ئەویش ئەوەیە کە پیتی (إن) نافیەیە و لە دوای ئەو (إلا) هاتوە واتای (حصر و قصر) دەگەیێنیت واتە: هیچ یاسایەك قبول نیە جگە لە یاسای الله تعالی .

هەر وەکو نفی وإثباتی وشەی (لاإله إلاالله).

کەواتە، یەکێک لە تایبەتمەندی الله تعالی، ئەوەیە تەنها بە شەرع و بە یاسای ئەو ژیان بەسەر ببردرێت، بزانە الله تعالی چۆن باسی دووڕوان دەکات؟ و دەفەرمووێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا)٦٠ النساء واتە: ئەرێ ئەوانەت نەدیوە دەڵێن باوەڕمان بەو بەرنامە و قورئانە هەیە کە دابەزێنراوە بۆتۆ و بەو پەیامەش کە پێش تۆ دابەزیوە، بەڵام دەیانەوێت بۆ دادگا و کێشەکانیان بچنە لای تاغووت و بەرنامە شەیتانییەکان؟ ! لە کاتێکدا فەرمانیان پێکرابوو

بەو بەرنامە شەیتانیانە باوەڕ نەکەن و کاری پێنەکەن، بەلام شەیتان دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕا کردنێکی یەکجار دوور و بێ سنوور، بۆیە ئاوا سەر بۆ بەرنامە دونیاییەکان شۆڕ دەکەن.!

کەواتە، نابێت باوەڕدار بە هیچ یاسایەک ڕازی بێت جگە لە یاسای الله تعالى، چونکە هەموو یاسایەک جگە لە یاسای ئیسلام، گومڕاییە، بزانە الله تعالى دەفەرموویێت: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ)٥٠/المائدة/ واتە: ئایا پشت لە حوکمەکەی الله تعالى ئەکەن و حوکمی جاهیلی و نەزانی و نەفامیان دەوێت؟ هەموو حوکم و بڕیارێك جگە لە حوکمی الله تعالى کە پێچەوانەی حوکمی الله تعالى بێت بێگومان ستەم و نەفامییە، جا کێ هەیە حوکمی باشتر و بە سۆزتر بێت لە الله تعالى؟ بەلام بۆ کەسانێك کە یەقینیان هەبێت، نەك بۆ کەسانێك کە نەفام و نەزان بن و شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبێتن و بە هەواو ئارەزوی خۆیان یاسا و ڕێسا دابنێن هەر وەکو خەڵکی سەردەمی نەفامی وایان دەکرد .

ئایا ئەگەر بانگخوازێکی موحید زینا بکات یان عەرەق بخوات پەنا بە الله تعالی کەس هەیە شوێنی بکەوێت؟ یاخود قسەکانی قبول بکات؟ بێگومان نەخێر، باشە ئەو کەسانەی ئەمڕۆ یاسا و ڕێسا بۆ خەلکان دادەڕێژن بێدین و سەرخۆش و شەرواڵ پیس نین؟ ! چۆن کەسێک خۆی بە مسولمان بزانێت و نوێژ ئەنجام بدات بەڵکو بە ناو مەلا و بانگخوازی ئیسلامی شوێنیان دەکەون، بۆ نەیان بیستوە الله تعالی فەرموویەتی: (أَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ)العنکبوت٤٥ واتە: نوێژ بکە چونکە نوێژی تێرو تەسەل ڕێگری لە مرۆڤ دەکات لە کاری خراپ و گوناح و تاوان.

بەلام الله تعالی ڕاستی فەرموو: (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ)/٣٧/ق/ واتە: بێگومان لەو سەر گوزەشتەی پێشیناندا ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی دڵ و ژیریان هەیە، یان بە باشی گوێڕاگر و ئامادەش بێت دڵ و گوێی بداتێ.

کەواتە، یاسادانان بۆ هیچ کەسێک نیە چونکە حەرام کردن و حەڵاڵ کردنە ئەوەش تەنها مافی اللەیە تەنانەت الله تعالی ڕازی نابێت

پێغەمبەرکەشی ﷺ شت حەڵاڵ و حەرام بکات، بزانە الله سبحانه و تعالى وەکو گلەیەک لە پێغەمبەر دەکات ﷺ و پێی دەفەرمووێت: (أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ)١/التحريم/ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت، کە الله تعالى بۆی حەڵاڵ کردوویت؟.

کەواتە، بۆ پێغەمبەریش ﷺ ڕەوا نیە چ جای کەسێکی بێ باوەڕ.

بزانە پێشەوا (إبن تيمية رحمه‌الله) کە دەفەرمووێت: من لە هەموو کەسێک دوورترم کە خەڵک کافر بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەفەرمووێت: (الإنسان متى حلّل الحرام المجمع عليه أو حرم الحلال المجمع عليه أو بدل الشرع المجمع عليه كان كافراً مرتداً باتفاق الفقهاء )مجموع الفتاوى(٢٦٧/٣ واتە: هەر کەسێک حەڵاڵێک حەرام بکات کە بە یەک دەنگی حەرام بێت یاخود حەرامێک حەڵاڵ بکات کە بە یەک دەنگی حەرام کرابێت کافرە و لە دین هەڵگەڕاوەتەوە بە یەک دەنگی زانایان.

چونکە، حەرام کردن و حەڵاڵ کردن واتە، خۆ لێچواندن بە اللە تعالی (پەنا بە اللە تعالی) لە تایبەت مەندیەکی اللە سبحانە وتعالی دەبێت بزانین اللە تعالی ڕازی نابێت هێچ فەرمان و یاسایەک هاوتا بێت لە گەڵ حوکم و یاسای خۆی، هەر وەکو دەفەرمووێت: (وَلا يُشرِكُ فِي حُكمِهِ أحداً) الكهف/٢ واتە: اللە تعالی لە کارو بڕیاری خۆیدا هیچ کەسێکی نەکردووە بە هاوتاو هاوبەشی خۆی، بێ شەریک و بێ وەزیر و بێ هاوتایە، ڕازیش نابێت قسەی ناحەز و نەیارانی بخرێتە پاڵ قسەی ئەو.

کەواتە، حوکم و یاسا دانان تەنها مافی اللە تعالی یە و بۆ هیچ کەسێک نیە و نابێت بە خۆی ڕەوا ببینێت.

بزانە اللە تعالی ئەو کەسانەی یاسا و ڕێباز بۆ خەڵک دادەنێن بە پەرستراو و شەریک ناو بردوە هەر وەکو فەرموویەتی: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ)٢١/شوری واتە: ئاخۆ ئەو بێ باوەڕانە هاوبەشانێکیان هەیە ئاینێکیان بۆ داناون کە اللە تعالی ڕێگەی پێ نەداوە.

براكانم لەبیرمان نەچێت قـورئان بۆدوو مەبەست هاتۆتە خوارەوە هەر وەكو شێخ الشنقیطی (رەحمەتی الله تعالی لێ بێت)

لە تەفسیری أضواء البیان (١٦٢/٨) و (٨٢/٤) دەفەرموویێت:

كاتێک الله تعالی لە سورەتی الزمر دا دەفەرموێت: (إنا أنزلنا إلیك الكتاب بالحق فاعبد الله مخلصا له الدین) واتە: بێگومان ئێمە بە حەق و ڕاستی قورئانمان بۆ تۆ هێناوەتە خوارەوە، كەواتە هەر خوا بپەرستە و هەر ملكەچ و دڵسۆزبە بۆ ئاین و بەرنامەكەی.

وە لەبەرامبەرەیشدا لە سورەتی النساء دا ئایەتی ١٠٥ دەفەرموویێت: (إنا أنزلنا إلیك الكتاب بالحق لتحكم بین الناس بما أراك الله) واتە: بێگومان ئێمە دامان بەزاندۆتە سەر تۆ ئەم قورئانە بۆ ئەوەی بڕیار و حوكم بدەیت بەو بڕیار و حوكمەی كە خودا پیشانی داویت.

ئینجا مەبەستی ئەوەیە ئەوە ڕوون بكاتەوە كە ئامانج لە ناردنە خوارەوەی قورئان بۆ سەر رسول الله ﷺ تەنها بۆ ئەم دوو خاڵەیە.

١) پەرستنی خودایە بە تەنها.

٢) حوكم كردنە بە شەریعەتەكەی لە نێوان خەڵكیدا.

شێخ العلامـة محمد الأمین الشنقیطي ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە کتابی [ في أضواء البیان : ٧ / ١٦٢ ] وتوویەتی : هاوەڵدانان بۆ الله تعالی لە حوکمدا ( حوکم نەکردن بە شەریعەتی ئیسلام ) و هاوەڵدانان بۆ الله عزوجل لە پەرستندا یەک مانایان هەیە و هیچ جیاوازیەکیان نیە هەرگیز.. وە ئەو کەسەی کە شوێنی نیزامێک دەکەوێت جگە لە شریعەت و نیزامی الله تعالی یان یاساو شەریعەتێک جگە لە شریعەتی الله تعالی ، وە ئەو کەسەی کە بت و صنم دەپەرستێت و سوجدەیان بۆ دەبات هیچ جیاوازیەکیان نیە قەت، هەردووکیان یەک شتن و وە هەردووکیان هاوەڵدانەرن بۆ الله عزوجل ...

کەواتە شوێنکەوتنی عەلەمانیەت و خۆش ویستنیان هیچ جیاوازی و فەرقێکی نیە لەگەڵ بت پەرستی..

## (التکفیر)

خۆشەیستانم پێم گرینگ بوو باسی بابەتی تەکفیر بکەین ئەویش با لە سەرەتادا بزانین کە الله تعالی دەفەرموویت: {هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُممُّؤْمِنٌ}٢ التغابن/ واتە: الله تعالی هەر ئەو زاتەیە ئێوەی دروستکردووە، کە هەتانە بێ باوەڕە بە ئارەزووی خۆی لە فیترەت لایداوە، هەندێکیشتان باوەڕدارە هەمیشە لەسەر نەخشەی فیترەت دەڕوات و لانادا.

کەواتە، باوەڕ و بێ باوەڕی بە دەست الله تعالی یە هەر کەسێک الله تعالی بە مسولڵمانی دانابێ دەبێت ئێمەش بە مسولڵمانی بزانین، و هەر کەسێکیش الله تعالی بە کافری ناو بردبێت دەبێت ئێمەش بەکافری بزانین، نە زیادەڕۆیی بکەین لە کافر کردن، و نەبشترسین لە کافر کردنی کافران، دەبێت بشزانین بە مسوڵمان کردنی کافر یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەکانی باوەڕ، بەڵام کافر کردنی مسوڵمان کوفری بچوکە ئەگەر لە بەر هەوا و ئارەزوی خۆی کافری بکات.

کەواتە، هەرکەسێک کوفری ئاشکرای ئەنجامدا بەبێ عوزر ئێمەش حوکمی کافر بوونی لەسەر دەدەین و ڕقیشمان لێی دەبێتەوە لەسەر کردارەکەی، چونکە پێغەمبەری الله (ﷺ) دەفەرموویت: (مَنْ أَظْهَرَ مِنْكُمْ خَيرًا ظَنَنَّا بِهِ خَيرًا وَأَحْبَبْنَاهُ عَلَيْهِ، وَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا شَرًّا ظَنَنَّا بِهِ شَرًّا وَأَبْغَضْنَاهُ عَلَيْهِ)٢٨٦/أحمد/ واتە: هەر کەسێک چاکەی لێ ببینرا ئێمەش گومانی چاکی پێ دەبەین و خۆشمان دەوێت، و هەر کەسێکیش خراپەی لێ ببینرا ئێمەش گومانی خراپی پێ دەبەین وڕقیشمان لێی دەبتەوە.

بەڕێزان هەندێک بە ناو مەلای بەجوبە وعەمامە بوونەتە داردەستی دەسەلات داران ئیشیان تەنها پاساو هێنانەوە بۆ تاغوت و ستەم کاران و خەڵک بەو فەرمودەیە دەترسێنن لە کافر کردنی کافریش کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێک بە برایەکەی بڵێت کافر ئەگەر وانەبێت بە خۆی کافر دەبێت.

بەڵام واتایەکەی ئاوانیە براکانم (إبن القيم رحمه الله) دەفەرموویت: کافر کردن یان بە دوورڕو دانانی مسوڵمان ئەگەر لە بەر دینی الله بێت نەک بۆ هەواو ئارەزوی خۆی بێت، ئەوە تاوان بار نابێت بەڵکو پاداشتیش لەسەر مەبەستە پاکەکەی وەردەگرێت. (٣ / ٣٧٢) زاد المعاد.

ئازیزان چەند نمونەیەک باس دەکەین بۆ ڕونکردن و پاڵپشتی ئەو بابەتە:

١ـ پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (رضی الله عنه) لە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیزنم بدە باسەری ئەم دوو ڕوە ببڕم، مەبەستی حاتب بوو (رضی اللەعنه) چونکە کارێکی دووڕوانی لەسەر ئاشکرا بوو نە پێغەمبەر(ﷺ) و نە هیچ هاوەڵێک نایان گوت: ئەی عومەر تۆ تەکفیری یان تۆ توندڕەوی.

/٣٠٠٧/ البخاري/٤٩٤٢مسلم

٢ـ پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەی دوو ڕوان بوختانیان بە دایە عایشە کرد پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر میمبەر فەرمووی: چیتان هەیە بۆ پیاوێک ئازارەکانی گەیشتە ناموسم؟

سەعدی کوڕی موعاز کە گەورەی هۆزی ئەوس بو فەرمووی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) واللە ئەگەر لە ئەوسیەکان بێت سەری دەبڕم و ئەگەر لە برا خەزرەجاکانیش بێت هەر فەرمانێک بفەرمووی لە سەری جێبەجێ دەکەین، سەعدی کوڕی عوبادەش کە گەورەی هۆزی خەزرەج بو گوتی واللە ئەگەر لەئەوس بێت نایکوژی وناشتوانی بێکوژی، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاز بوو بە سەعدی کوڕی عوبادەی گوت: واللە درۆتکرد واللە دەیکوژین بەڵام تۆ دووڕوی و پاڵپشتی لە دووڕوان دەکەی، یەک کەس نەیگوت ئوسەید بۆ ئەوەندە توندڕەوی یان تۆ کەسێکی تەکفیری.

/٤٧٥٠/البخاري/٢٧٧٠/مسلم

٣ـ موعازی کوڕی جەبەل (رضی اللەعنە) لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دەکرد و دەگەڕایەوە ناو هۆزەکەی پێش نوێژی بۆیان دەکرد جارێکیان موعاز سورەتی البقرەی لە پێش نوێژی خوێند مسوڵمانێک نوێژەکەی بە تەنیای تەواو کرد و ڕۆیشت کە موعاز زانیەوە گوتی واللە ئەو کەسە دوو ڕوە، کە پیاوەکە زانی موعاز پێی گوتوە دووڕوو لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای لە موعاز کرد و گوتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە ئیش وکارمان هەیە دوێنێ شەو موعاز سورەتی البقرە خوێند منیش نوێژەکەم بەتەنها تەواو کرد و ڕۆیشتمە سەر ئیش و کارەکانم موعاز پێی گۆتم دووڕو، پێغەمەری بەسۆز(ﷺ) فەرمووی: ئەی موعاز چەند سورەتێکی بچوک بخوێنە بەڵام نەیفەرموو: بۆ پێت گوت دووڕوو. /٦١٠٦/البخاري/مسلم/٤٦٥/.

براکانم نموونە زۆرە بەڵام ئەوەندەم پێ باشبوو بۆ ئەو کەسەی بیەوێت لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام بێت و ئەوە قسەی زانایانی ئەهلی سوننە وجەماعەن نەوەک وابزانن بە هەواو و ئارەزوی خۆمان ئەو قسانە دەکەین.

بزانە وتەی (ابن القيم رحمه الله) کە دەفەرموویّت: پێغەمبەر (ﷺ) گلەیی لە ئیّهامی عومەر نەکرد کە بەحاتبی ئەهلی بەدری باوەڕداری گوت دووڕو، هەر وەها گلەیی لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیریش نەکرد کە بە سەعدی کوڕی عوبادەی گەورەی پشتیوانان گوت دووڕوو.

/إعلام الموقعين /٤/ ٦٩/

دەتوانن بگەڕێنەوەبۆ ئەو نموونانە بەڵام بە کورتی هێنامەوە.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.




پرۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامیە لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوار و فیکرە سەرلێشێواوەکان دەوەستێتەوە کتێبخانەی تویشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوای دەکات